# ووتەی الله و تەفسیری سەلەف
# سەبارەت بە
# ویستی یوسف علیه السلام

ئەمە بۆ کەسێکە شوێنکەوتەی سەلەفی ئەم ئومەتە

بێت، بۆ کەسێک نیە دەروێشی گرووپ و حیزب و ئەقڵی

بێت

وەرگێڕانی

طارق الكردي

## | پێغەمبەر یوسف علیه السلام وەک ژنەکەی عەزیزی میصر هەمان ویستی ئەو تاوانەی هەبوو |

تـەفسیری ئایەتێک کـە ئەمەش وەک هەموو شتەکانی دی متأخرین لێیان شێواندوین و پێچەوانەی سەلەفیان کردووە .

گێڕانەوەکانیان لەم تەفسیری ئایەتە هەمویان پێ ضەعیفە و بە ئیسرائیلیات ناوی دەبەن لەکاتێکدا بە صحیحی و ضەعیفیش لەم باسەدا گێڕانەوەکان هاتون ئێمە لێرە تەفسیر و ریوایەتەکان دەخەینە بەردیدی ئێوەی ئازیز شتێک زیاد ناکەین تەنها بۆتان نقڵ دەکەین ، تاکەس واگومان نەبات ئێمە بەباسکردنی ئەم شتانە کوفرمان کردوە یان تۆمەتمان داوەتە پاڵ پێغەمبەرێک گەر بۆ ئێمە کوفر بێت ئەی سەلەف کە نقڵیان کردوە بۆ ئەوان چیە؟

خـۆتان وەڵامــی ئەو پرسیارە بدەنەوە لەکاتێکدا ئێمە تەنها وتـەی ئەوانمان نقڵ کردوە .

دەربـارەی ئـەم ئایەتە (وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ ۖ وَهَمَّ بِهَا) ئـەمە زاهیـری ئایەتەکەیە کاتێک ژنــی عەزیزی مصر ویستــی لەگەڵ یوســف زینا بکـات یوسفیش هەمـان ویستی بۆ پەی دابوو.

ئـەوەی ئـەم بـاسـە ڕوون دەکاتـەوە:-

تـەفسیرەکـەی ابـن عبـاس ـە کـە دەفەرموێـت : یوسف هەمان ویستی هەبوو بۆ کارەکەی ژنی عەزیزی مصر بانگی بۆ کرد وە یوسف جلەکەشی داکەند ، ئەوجا بانگی لێ کرا : ئەی کوڕی یەعقوب ئەتەوێ زینا بکەیت ؟

( تفسير ابن أبی حاتم - ١١٤٧٤)

ابن عباس دەڵێت : کاتێک ژنەکەی عەزیزی مصر خۆی ڕازاندەوە بۆ یوسف و لەسەر جێگا ڕاکشا ، یوسف یش کە لە لاویەتی تەمەنیدا بوو لە بەردەمیدا دانیشت و پۆ شاکەکەی کـردەوە . بانگ کـرا ئەی یوسف وەک باڵندەیەک مەبە کە پەڕەکەی لێبووەتەوە ، یـوسف جیبریلی بینـی لـە شێوەی یەعقوب کە گازی دەگرت لە پەنجەی ئیدی یوسف هەستاو دەستی هەڵگرت .

( تفسیر ابن أبی حاتم - ١١٤٧٤ )

موجاهید دەڵێت : پۆشاکەکەی خوارەوەی لابرد یوسف.

( تفسیر ابن أبی حاتم - ١١٤٧٤)

موجاهید دەفەرموێـت : پۆ شاکەکەی لادا و شەیتان ویستی ئەو تاوانەی بۆ یوسف دروست کرد ، جا ئەمە قەولی زۆرینەی سەلەفە وەک : سەعیدی کوڕی جوبەیر و حەسەنی بەصری .

تفسیر البغوي

أبـو عبید قاسمی کوڕی سەلام دەڵێـت :کەسانێک ئـەم وتە ڕەتئەکەنەوە و قەبوڵیان نیە بەڵام وتە وتەی پێشین و سەلەفە ئەوان زانا و شارەزاتربوون بەوەی " الله تعالی " دەیڵێیت لـە قورئان دەربارەی پێغەمبەران .

تفسیر البغوي

ابن اسحاق و سدی دەڵێـن : ژنەکەی عەزیزی مصر زۆرجوان بوو یوسفیش لە جوانی و گەنجێتی تەمەن یدا بوو.

وتی : یوسف تۆ چاو و قژ و ڕوخسارت زۆر جوانە بەردەوام وەسفی دەکرد و تەماعی ئەدا بەیوسف تاوەکو یوسفیش ویستی بۆ ئەو کارە پەیدابوو ، بەڵام " الله تعالی " بەڵگە گەلێکی نیشاندا و یوسف دەستی هەڵگرت .

تفسیری البغوي

حەسەنــی بــەصری دەفــەرموێــت : الله تاوانــی پێغەمبەران بــاس ناكات بــۆ ئەوەی عەیــب داریــان كات ، بەڵكو بۆ دیار خستنــی نیعمەتەكانیەتــی بۆیان ، بۆ ئەوەی هیچ كــەس نائومێد نەبێــت لە ڕەحمەتی الله تعالی .

تفسير البغوي

زۆرێک بە واتای بێسەروبن ئەم ئایەتەیان تەفسیركردوە و هەڵە لێكیان داوەتەوە هەریەكە و بەجۆرێک دەڵێن حەزی دەكرد ژنی بێت یان لێكدانەوە دی ، تەنانەت تەفسیرە كوردیەكانیش ئەم باسەیان شێ واندووە .

بەغەوی دەڵێــت : ئــەم تەفسیرە هەڵەیە و وانیە ، كــە پێچەوانــەی سەلەف كردوو یانە .

ابــن أبي مولەیكە دەڵێت : پرسیــم لە ابن عباس ویست و هەمی یوسف تــا كوێ ڕۆشت؟

فەرمــووی : كاتێک ژنــی عەزیزی مصــر ڕاكــشا لەسەر جێگاكــە یوسفیش دانیشت لە نێوان قاچەكانی ، بۆ ئەو كارە .

( تفسير الطبری - ١٩٠١٨)

یوســف دانیشت لە نێوان قاچەكانی زولەیخا بۆ ئەوەی جلەكانی داكەنێت .

( تفسير الطبری - ١٩٠٢١)

موجاهید دەفەرموێت : دانیشت بەوشێوەی پیاو بۆ ژنەكەی دادەنیشێت .

( تفسير الطبری - ١٩٠٢٥)

پرسیار كرا لە ابن عباس ئایا ویستی یوسف تا كوێ گەیشت ؟

فەرمووی : پۆ شاكەكەی خوارەوەی لابرد و دانیشت بۆ ژنی عەزیزی مصر.

( تفسير الطبری - ١٩٠٣١)

جا دواتر الله تعالی ده‌فه‌رموویّت ( لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَـٰنَ رَبِّهِۦۚ ) گه‌ر نیشانه‌ و به‌ڵگه‌ی الله ـ ی نه‌دیبا ده‌که‌وته‌ ئه‌و تاوانه‌ .

( ابن أبی حاتم - ١١٤٨٧ ) ، تفسیر البغوی

جا له‌ ته‌فسیری ئه‌و نیشانه‌ و به‌ڵگه‌ زانایان ده‌ڵێن :

سه‌عید ـی کوڕی جوبه‌یر ده‌ڵێت : له‌وکاته‌ یه‌عقوبـی باوکی بینی دای له‌ سینگی شه‌هوه‌تی هه‌مووی له‌ به‌ینی په‌نجه‌کانیه‌وه‌ ده‌رچوو .

( تفسیر الطبری - ١٩٠٧٨ )

له‌و کتابانه‌ی ئه‌م باسه‌یان به‌و جۆره‌ باسکردوه‌ که‌ ئێمه‌ ڕوونمان کردەوە به‌بێ ئینکاری کردن .

- مصنف عبدالرزاق.
- العظمه ألبی شیخ.
- اعتلال القلوب للخرائطی.
- المستدرک للحاکم.
- الحلیه أبو نعیم.
- الزهد الکبیر للبیهقی.
- المختاره للمقدسی.

ئه‌و موفه‌سیرانه‌ی ئه‌م ته‌فسیره‌یان وه‌ک خۆی گێڕاوه‌ته‌وه‌ به‌بێ ئینکاری کردن .

سوفیان ـی الثوری له‌ ته‌فسیره‌که‌ی.

مقاتل بن حیان له‌ ته‌فسیره‌که‌ی.

أبو جه‌عفه‌ری نحاس له‌ ته‌فسیره‌که‌ی.

الفراء له‌ ته‌فسیره‌که‌ی.

الزجاج له تەفسیرەکەی.
سعید بن منصور له تەفسیرەکەی.
ابن جریر له تەفسیرەکەی.
ابن أبی زمنین له تەفسیرەکەی.
ابن ابی حاتم له تەفسیرەکەی.
أبو قاسم أصبهانی له اعراب القران.
جگـەلەوانیش.

یوسـف علیـه السلام عەورەتـی دەرنەکەوت ، پۆشاکێکـی لەبەردا مابوو کـە عەورەتی داپۆشی بوو ، پێش ئەوەی هیچ کارێک ئەنجام بدات " الله تعالی " لەو کارە دووری خستەوە و نەکەوتە ناوی.

٥٥| ئەوەی ڕوویـدا پێـش بونیەتـی بـە پێغەمبەر یوسف علیه السلام داوای لێخۆشبون دەکا لـە " الله تعالی "
(وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُور رَّحِيم).

زۆرینـەی متـأخریـن پـێچەوانـەی سەلەفیان کردوە و ئـەم شتانـە بـە درۆ و ئیسرائیلیات دەزانن ، بەڵام وتە وتەی سەلەفە.

ابن الأنباری لـە کتابی أضداد دەڵێـت : ئەوانەی ویستـی یوسف یان جێگیر کردوە و باس یان کردوە هەر لە علی و ابن عباس و وهب و ابن سیرین و جگە لە وانیش ، ئەوانە شارەزاترن بە مافی پێغەمبەران وە بەرزی پلەیان لای الله لەوانەی ئینکاری ئەم باسەدەکەن .

طبری لە تەفسیرەکەی دەڵێت ١٦ /٣٤
بەڵام ئەوانــی تــر کــە موخالیفــی سەلەفیان کردوە و قورئانیان بــە بۆچونــی خۆیان لێکداوەتەوە ، لەم باسەدا کۆمەڵێ قسەی پێچەوانەیان وتوە

أبوبکر الأنباری دەڵێــت : ئــەوەی ئێمــە بــۆی دەچیــن وە ئــەوەی اجماعــی هاوەڵانی حەدیث و ئەهلی علم ی لەسەرە وە بە صحیحی ریوایەت کراوە لە علی کوڕی أبی طالب و أبی صالح و محمدی کوڕی کعبی قورەظی و قتادە و جگە لەوانیش ئەوەیە کە : یوسف علیه السلام ویستی هەبوو ویستێکی ڕاست لەوەی الله لــە قورئــان زۆر بەڕونــی باســی کردوە ، ویستــی ئــەو ، هەڵەیە کــە یوســف تێیکەوتوە وەک چۆن هەندێکی دی لە پێغەمبەران کەوتونەتە هەڵەوە.
( الأضداد - ٣٣٣ )

لــە کۆتایدا ئەوەی ماوە بوترێــت : بــاسکردنــی ئــەم بەسەرهاتە قورئانیە بــۆ ئەوە نیە بمانەوێت تاوانی پــێ ئاسان کەین لای خەڵکــی و بە ئاسانی تاوان بکەن و بوترێت مادام ئەوە حاڵی پێغەمبەرێکە کەوایە بەندەی ئاسایی ئەولاتر بەو تاوانە ، نەخێر ئەمە تەنها بریتیە لە نقڵ کردنی بابەتێک کە سەلەف بەبێ شەرم کردن گێڕاویانەتەوە و ئینکاریان نەکردوە.
نەشیــان فەرمووە هەمــووی ئیسرائیلیاتە و درۆیە، وەک متــأخرین دەیڵێــن.
علیــه الصلاة والسلام علــی رسول الله یوســف الصدیق ابــن یعقــوب علیهما السلام.
والحمدلله.

**٨/٩/٢٠٢١ طارق الكردي**

**کۆتا پێدا چونەوە**